مشتێك لە خەرمانی زانست





# لاشەی ئادەمیزاد



## لە روانگەی زانستەوە

جلال الدین نجم الدین

١٤٢٣ك - ٢٠٠٢ز

[redacted]

(١)

# مشتێک لە
# خەرمانی زانست

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر لە هەولێر

[redacted]

بسم اللّٰه الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: مشتێك له خه‌رمانی زانست.

تیراژ: ٣٠٠٠ دانه.

چاپ: چاپخانه‌ی ژین/ هه‌ولێر.

ژماره‌ی سپاردن (١٩٥) ساڵی (٢٠٠٢).

له بڵاوكراوه‌كانی كتێبخانه‌ی رۆشنبیرله هه‌ولێر

یەکێك لە بەخششە گەورەو گرانبەهاکانی خوای پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد عەقڵ و ژیریەکەیەتی، کە بووەتە جیاکەرەوەی لە دروستکراوەکانی تر و، بە هۆی ئەم هۆش و بیرو ژیرییەوە توانیویەتی لە هەموو دروستکراوەکانی تر رابمێنێت و سەرنجی خۆی تۆمار بکات لە سەریان و، شتی گرنگ و نوێ بدۆزێتەوە و، داهێنانی نوێ بێنێتە کایەوەو، هزرو بیری خۆی دەوڵەمەند بکات..

ئەگەر سەرنج بدەین لە مێژووی مرۆڤایەتی، ئەو حەقیقەتەمان لەلا بەرجەستە دەبێت کە هەمیشە ئادەمیزاد لە بواری زۆرکردنی زانیاری خۆیدا لە هەوڵێکی بەردەوامدا بووە و، لەگەڵ بەرەو پێشچوونی رۆژگاردا ئەویش زیاتر و زۆرتر فێربووە و، نهێنی زۆرتری دۆزیوەتەوەو، رووبەری زانین و زانستی خۆی فراوانتر کردووە.

سەدەی بیستەمیش وەکو بڕگەیەکی زۆر گرنگ لە مێژووی مرۆڤایەتی‌دا، سەدەی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا بوو، هەزاران ئامێر و دەزگاو داهێنانی نوێو سەرسوڕهێنەری تیادا دروستکرا، گەلێك

زانیاری و نهێنی گرنگی تیادا دۆزرایەوە.
یەکێك لەو بوارانەیش کە زانستی هاوچەرخ ئیشی زۆری تێدا کردوە، لاشەی ئادەمیزاد خۆیەتی، تا پەی ببرێت بە نهێنییە سەرسوڕهێنەرەکانی و، هەنگاوێکیش بێت بۆ دۆزینەوەی هۆی نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان ، ئەمەیش وەك هەنگاوی یەکەم بۆ هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان.. جا لە ئەنجامی ئەو توێژینەوە زانستیانەی کە لەم بوارەدا ئەنجام دراون، زانستی هاوچەرخ خەرمانێکی ئێجگار گەورەی زانیاری (معلومة)ی کۆکردۆتەوە و هەزاران نهێنی ئێجگارسەیری دۆزیوەتەوە.. ئەمەی کە لەم نامیلکەدا دەیخەینە پێش چاوی خوێنەرانی خۆشەویست، تەنها مشتێکی گچکەیە لەو خەرمانە گەورە سەرسوڕهێنەرە. بەو ئومێدەی مایەی سوود بێت:
* مێشکی هەموو ئادەمیزادێك لە نزیکەی (سیازدە ملیار) دەمارەخانە پێکهاتووە، کە بە سستەمێکی ئێجگار وردو سەرسوڕهێنەر بەستراون بە یەکترەوە!
* قەبارەی گەورەترین خانەی دەمار لە لەشی

ئادەمیزاددا ( هەزار ) ئەوەندەی قەبارەی بچوکترین خانەی دەمار گەورەترە !.

* ئادەمیزاد لە تەمەنی سی (٣٠) سالّی بەدواوە رۆژانە (٣٠ –٥٠ ) هەزار دەمارەخانەی دەفەوتێت و هی نویّ دیّتە شویّنی!.

* میّشکی هەر ئادەمیزادیّکی سروشتی، کە تەمەنیّکی مامناوەندی بردبیّتە سەر، بە دریّژایی میّژووی ژیانی ئەو کەسە نزیکەی ١٠,٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠ (واتە ١٠ کوادرلیۆن) یەکە(وحدة) زانیاری وەردەگریّت!

* تیژیی و خیّرایی هەوالّناردنی دەزگای دەمار لە ئادەمیزاددا بە رادەیەکە کە تەنها لە یەك چرکە (ثانیة)دا سەد مەترە !.

* تیّکرای کیّشی میّشکی ئادەمیزادی سروشتی هەزارو چوارسەدو پەنجا گرامە!

* ریّژەی قەبارەی میّشکی ئادەمیزاد لە چاو لاشەیدا، لە کەسی سروشتیدا، نزیکەی( ١ : ٤٦) دەبیّت !

* دریّژی هەر سپیّرمیّك کە خودا کردویەتی بە

بناغەی خولقاندنی مرۆڤ، بریتیە لە تەنها( ٦٠ )بەش لە هەزار بەشی مللیمەترێك !..وە ژمارەشیان لە هەر جارێکدا نزیکەی (٢٠٠ )ملیۆن سپێرمە، کە مرۆڤ لە تەنها یەك دانەیان دروست دەبێت و ، هەموو ئەوانی تریان دەمرن !.

* تێکڕای کێشی دڵ لە مرۆڤێکی ئاساییدا (سێصەد و دوازدە) گرامەو، قەبارەکەیشی هێندەی مستەکۆڵەیەکە !

* دڵی مرۆڤی ساغ لە کەسی سروشتیدا ئەگەر بە تێکڕایی وەربگریت ساڵانە زیاتر لە (چل ملیۆن) جار لێدەدات !

* لێدانی دڵی ئادەمیزاد لە حاڵەتی ئاساییدا لە نێوان ٦٠ تا ٨٠ جارە لە دەقیقەیەکدا، جا بۆ بەراورد: لێدانی دڵی فیل ٢٠ جارە، گا ٢٥ جارە، بۆق ٣٠ جارە، کەروێشك ٢٠٠ جارە، مشك ٥٠٠ جارە لە دەقیقەیەکدا !

* خانەکانی دڵ و گورچیلە و جگەری ئادەمیزاد تەنها ( ١٠\١١ )ی وزەو توانای خۆیان لە کارەکانیاندا دەخەنە کار، ئەو (٩) بەشەکەی تری وزەو توناکەیان

بــە ئــەنبارکراوی هــەڵدەگرن و، لـــە کـــاتی زۆر پێویستدا سوودی لێ وەردەگرن و دەیخەنە کار !

* بیلبیلەی چاوی ئادەمیزاد (سەدو سی ملیۆن) روناکی وەرگـری تیادایـە ، کـە بـە سســتەمێکی زۆر ئاڵۆز بەستراونەتەوە بە دەمارەکانەوە!

* چـاوی ئـادەمیزاد دەتوانێــت (١٢٠ تــا ١٢٥ ) رەنگـــی جۆراوجــۆری دیــاریکراو لــە یــەکدی جیــا بکاتــەوە، هــەروەها لــە توانایشــیدایە کــە ( ١٠ملیـۆن) رەنگی ئاوێتەکراو و تێکەڵاو بناسێتەوە!

* برژانــگ و پێڵــووی چــاوی ئــادەمیزاد، چــاووی دەپــارێزن لــە تــەپوتۆزو شــتی نــامۆ و ترســناك و مەترسیدار بۆ چاو ، هەروەها برژانگ سێبەر دروست دەکــات بـۆ چــاو و لــە تیشــکی راســتەوخۆی خـــۆر دەیپــارێزێت و تیشــکەکان دەشــکێنێتەوە ، پێڵـــوش ناهێڵێت چاو تووشــی ووشــکبوونەوە ببێـت ، چونکـە زوو زوو بە فرمێسك دەیشوات و پاکژی دەکاتەوە!.

* تێکـڕای هــێزی بینینـــی چــاو لــە ئــادەمیزادی سروشتیدا دەگاتــە (٠,٠٠٠٣)پلـە بـۆ هـەر خولـەکێك (دەقیقەیەك) !

* له فرمێسکی ئادەمیزاددا جۆرە ماددەیەك هەیە کە دەتوانێت زیاتر لە (سەد) جۆر بەکتریاو ڤایرۆس بکوژێت، سەیر لەوەدایە ئەگەر ئەو فرمێسکە شەشسەد جار روون (تخفیف)یش بکرێتەوە، هەر هەمان تواناو کاریگەریی خۆی دەمێنێت!

* ئەگەر ئادەمیزادێك تەمەنی حەفتا ساڵ بێت، ئەوە لە ماوەی تەمەنیدا مۆخی ناو ئێسقانەکانی لاشەی ئەو ئادەمیزادە هێندەی قورسایی ( ٦٥٠ کیلۆگرام)خرۆکەی سوور و قورسایی (یەك تەن)یش خرۆکەی سپی دروست دەکات!.. ئەمە لە حاڵێکدایە هەموو ئەو مۆخەی کە لە ناو ئێسقانەکانی لاشەی ئادەمیزادێکی ئاساییدا هەیە کێشەکەی نزیکەی تەنها ( ٢٦٠٠ گرام) ە!

* خرۆکە سوورەکانی ناو خوێنی ئادەمیزاد، کە بە زۆریی تەمەنیان تەنها( سەدو بیست )رۆژە، لە ماوەی تەمەنیاندا هێندە بەخێرایی لەناو خوێندا دێن و دەچن، ئەو مەسافەی لەماوەی ئەو تەمەنەیاندا دەیبڕن ، گەر بخرێتە سەر یەك ، ئەوەندەی درێژایی رێگایەك دەبێت کە نزیکەی هەزارو سەد و پەنجا کیلۆمەتر درێژ بێت!

* ئەگەر سەرجەم بۆری و مولوولەکانی خوێنی ناو لاشەی ئادەمیزادێك بخرێتە سەر یەك، نزیکەی (سەد هەزار) کیلۆمەتر درێژییان هەیە!

* لە ماوەی تەنها یەك کاتژمێردا ، نزیکەی (پێنج ملیار) خڕۆکەی سوور لە ناو خوێنی ئادەمیزادێکی پێگەیشتوودا لەکار دەکەون و دەمرن!

* هەموو خڕۆکەیەکی سووری ناو خوێنی ئادەمیزاد، دوو سەدو حەفتا ملیۆن وردیلەی هیمۆگلۆبینی تێدایە!

* گورچیلەکانی مرۆڤێکی سروشتی و ساغ رۆژانە نزیکەی هەزار و هەشت صەد لیتر خوێن دەپاڵێون!

*تیرەی هەر خڕۆکەیەکی سووری قەبارە مامناوەندیی (حەوت مایکرۆن)ە !.. (هەزار) مایکرۆنیش ئینجا دەکاتە (یەك ملیمەتر) !

* هەر دڵۆپەخوێنێك کە لە دڵەوە دەردەچێت و دەچێت بۆ مێشك و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو دڵ ، لەو گەشتەیدا تەنها (هەشت) چرکە (ثانیة)ی پێ دەچێت ، هەر دڵۆپە خوێنێکیش کە بەرەو قاچەکان

دەڕوات ، تا دەگەڕێتەوە بۆ دڵ تەنها (هەژدە) چرکە (ثانیة)ی پێ دەچێت!

* خودای گەورە هەر تاڵەموویەك و ، هەر دڵۆپێك لە خوێن و ، هەر دڵۆپێك لە لیکی دەمی ئادەمیزادی وا دروست کردووە، کە ناسنامەیەکی تەواوی خاوەنەکەی پێیەو ، دەکرێت خاوەنەکەی پێ بدۆزرێتەوە !.. بۆیە دەکرێت لە رێگەی تاڵێك موو یان دڵۆپێك خوێن یان دڵۆپێك لیکی دەمەوە تاوانباران بناسێنرێنەوە!

* لە تێکڕای رووبەری پێستی ئادەمیزاددا (سێ ملیۆن) غوددەی دەرەقی هەیە!

* نزیکەی ( دە ملیۆن)خانەی عەرەقڕژێن لە پێستی ئادەمیزادی ئاساییدا هەیە !

* تێکرای رووبەری پێستی ئادەمیزادێکی جەستە مامناوەندی نزیکەی دوو مەتر دووجایە!،

* لە تێکڕای پێستی ئادەمیزاددا پێنج سەد هەزار خانەی هەست پێکردن هەیە !.

* ئەو کونە وورد ووردانەی کە لە پێستی ئادەمیزادا هەن و، عەرەقی لاشەیان لێ دێتە دەرەوە،

له هەریەکە لەو کونە ورد  وردانەدا زمانەیەك هەیە کە رێگە دەدات عەرەق لە کونەکەوە بێتە دەرەوە، بەلام هەرگیز رێگە نادات لە دەرەوە ئاوی لێوە بڕواتە ژوورێ !

* پێستی هەموو ئادەمیزادێکی ئاسایی (دوو سەدو پەنجا هەزار)پێوەری سەرما و (سی هەزار) پێوەری گەرمای تێدایە!

* لاشەی ئادەمیزادی سروشتی لە زیاتر لە (سەد تریلیۆن) ۱۰۰,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ خانە (خلیة) پێکهاتووە!

* ئەگەر گشت بەشە پێکهێنەرەکانی تاکە خانەیەکی لاشەی ئادەمیزاد بخرێنە سەر یەك ، ئەوا قەبارەیان نزیکەی (یەك مایکرۆن سێ جا) دەبێت ! کە مایکرۆنێك = ۱۰۰۱۱میلیمەتر !

* قژی سەری مرۆڤ رۆژانە (۰,۳۵–۰,٤۰)میلیمەتر زیاد دەکات !

* ژمارەی ماسولکەکانی لەشی ئادەمیزاد لە نێوان (چوار سەد)تا (شەش سەدو هەشتا) ماسولکەدایە!

* ئەو مادەیەی کە پێکهێنەرێکی سەرەکییە لە

ئێسکی ئادەمیزاددا، سێ ئەوەندەی ماددەی خشتی سوورەوەبووی دیوار (کەرپوچ) بە هێزترو پتەوترە !

* هەر دەستێکی ئادەمیزد (نۆزدە) کۆمەڵە ماسولکەو، (بیست و حەوت) ئێسکی تێدایە، هەرگیز هیچ ئامێرێکیش وەکو دەست نی یە، کە بە سیماو رواڵەت زۆر سادەو جوانەو ، دەیان جۆر جوڵەو کاری جۆراو جۆریشی پێدەکرێت، وەکو : گرتنی قەڵەم و کەوچك و دەرنەفیز ، هەڵدانەوەی لاپەڕە، داخستنی دەرگا٠٠٠٠ هتد!

* نینۆکی پەنجەکانی دەست رۆژانە ( ٠,٨٦ )ملیمەتر و نینۆکی پەنجەکانی قاچیش رۆژانە( ٠,٠٥ ) ملیمەتر زیاد دەکات .

* هەموو ئێسکێکی قەبارە مامناوەندیی لە لاشەی ئادەمیزاددا نزیکەی ( دە بلیۆن ) لیفی ماسولکەیی تیادایە!

* تەنها ئێسکی ڕان ، لە زیاتر لە ( سی هەزار) کۆڵەکەی کلسی پێکهاتووە!

* کێشی گشتی سەرجەم ماسولکەکانی لەشی پیاو نزیکەی٤٠٪ی کێشی گشتی لەشیەتی ، بەلاّم لە

ئافرەتدا نزیکەی ٣٠٪ ی کێشەکەیەتی.

* لە(٦٠٪)ی لاشەی ئادەمیزاد لە ئاو پێکهاتووە، ئەم ڕێژە زۆرەیش دابەش بووە بە سەر پێکهاتەی ئەندام و کۆئەندامە جیاجیاکانی لاشەیدا !

* ئادەمیزاد کاتێك هەست بە تینوێتی دەکات،کە بە ڕێژەی (١٪)ی کێشی خۆی ئاو لە لەشیدا نەمێنێت. خۆ ئەگەر لە ڕێژەی (١٠٪)ی کێشی خۆی زیاتر ئاو لە لەشیدا نەمێنێت، ئەوە لە تینوێتیدا دەخنکێت!

* لە رووبەری هەر (یەك سانتیمەتر) دووجا لە ریخۆڵەکانی ئادەمیزاددا، (سێ هەزار و شەش صەد) مەمیلەی ورد هەن ، کە کاریان هەڵمژینی ماددە بەسوودەکانی ناو خۆراکی هەرسکراوە لە ریخۆڵەکاندا!

* هەموو ئادەمیزادێکی سروشتی، رۆژانە لە کاتی هەناسەدانیدا بە تێکڕایی (صەدو هەشتا مەتر سێجا) هەوا هەڵدەمژێت!

* سەرجەم بڕی ئەو ئاسنەی کە لە لاشەی ئادەمیزادێکی سروشتیدا هەیە، کێشەکەی نزیکەی

(شەش) گرامە.. کەچی ئەم بڕە ئاسنە کەمە رۆڵێکی ئێجگار گرنگ و کاریگەری هەیە لە پێکهاتەی هیمۆگلۆبینی خوێندا !

* ئادەمیزاد بە شێوەیەکی گشتی دەتوانێت نزیکەی (چوار هەزار) دەنگ، کە بە پلەی جیاجیا بن ، لە یەکتری جیا بکاتەوەو بیانبیستێت و بیانناسێتەوە!

* (گوێچکەی ناوەڕاست) کە بەشێکە لە پێکهاتەی دەزگای بیستن لە ئادەمیزاددا، نزیکەی (چوار هەزار)کەوانەی زۆر ورد و ئاڵۆزی تێدایە، کە تایبەتن بە وەرگرتنی دەنگ و ناردنی بۆ مێشك بۆ لێکدانەوەو ناسینەوەی دەنگەکان!

* گوێی ناوەوەی ئادەمیزاد نزیکەی ٢٥٠٠٠ خانەی تێدایە کە دەنگەکان وەردەگرن و کاریان تێ دەکەن !

* زبانی ئادەمیزاد ( نۆ هەزار) خانەی چەشتنی تێدایە، کە بە هۆی ئەو خانانەوە تامەکان: شیرین ، ترش ، سوێر ، توند ، تاڵ ، مزر ، ..لێك جیا دەکاتەوە!

* ئەو رووبەرەی  کە تایبەتە بە هەستی بۆنکردن لــە لووتــی ئــادەمیزاددا نزیکــەی پێنــج ســانتیمەتر دووجایــە ،لەو رووبەرەدا نزیکەی یەك ملیۆن وردیلــە دەماری بۆنکردن هەیە !.

* هەموو ئەندامێك لــە ئەندامــەکانی هەســتکردنی تەنها یەك کاریان لە ئەستۆدایە، چاو: بینین ، گوێ: بیستن ، لووت: بۆنکردن ،  پێست: هەست پیٚکردن.. بەڵام خودای گەورە (زبان)ی بە شێوەیەکی وا دروست کــردووە کــە کۆمــەڵێك کــار ئــەنجام دەدات: ئــامێری چەشتنی تامە، ئامێرێکی بەهێزو بــزۆزە بــۆ بــادان و قوتــدان و هەرســـکردن ، ئـــامێری هەســـتکردنە بـــە بەرکەوتن ، لە هەمووشیان گرنگتر دەزگای قسەکردنە!

* قورســایی شــوێنی پەنجــەمۆرێکی ئــادەمیزاد دەگاتــە(١ \ ١ ملیــۆن گــرام)! کــەچی لەگــەڵ ئــەو کێشــە کەمەیشدا، هەر پەنجەمۆرێکی  ئادەمیزاد بڕێك ئاو و، چەوری و، خوێ..ی پێستی پەنجەی  پێوەیە!

* ئەگــەر ژمــارەی دانیشــتوانی ســەر زەوی بگاتــە (شەست و چوار ملیار) کــەس، ئینجا ئەگــەری ئــەوە هەیە کــە ســەرپەنجەی تەنــها دوو کــەس بــە تــەواوی

لەیەك بچن! شایانی باسە ئێستا دانیشتوانی زەوی تەنها شەش ملیار کەس تۆزێك زیاترە!

*لە ناو هەزاران جۆر ڤایرۆسدا ، تەنها نزیکەی (سەد) جۆریان زەرەریان بۆ مرۆڤ هەیەو دوچاری نەخۆشی و ئازاری دەکەن!

* هەندێك جۆری میکرۆب کە دەگەنە ناو لاشەی ئادەمیزاد ، زۆر بە خێرایی زیاد دەکەن، بە شێوەیەکی وا کە تەنها لە ماوەی کاتژمێرێکدا یەك میکرۆبیان (حەڤدە ملیۆن) میکرۆبی تری لێ دەکەوێتەوە!.. جا لێرەدا سستەمی بەرگریی لەش دەکەوێتە کارو بەرەنگاری ئەو لەشکرە دوژمنە دەبێتەوە، تا مرۆڤ توشی نەخۆشی نەبێت!

* کۆرپەلە لە سکی دایکیدا بە (سێ) پەردەی تاریك داپۆشراوە: یەکەمیان: پەردەیەکە راستەوخۆ کۆرپەلەکەی داپۆشیوە، (ئەمینۆن)ی پێ دەڵێن. دووەمیان: ناوی پەردەی (کۆریۆن)ە ، پەردەی سێیەمیش ناوی پەردەی (دسیدیوەڵ)ە.. خودای گەورەش لە قورئاندا فەرموویەتی: (یخلقکم في بطون امهاتكم خلقاً من بعد خلق ، في ظلمات ثلاث).

* بەپێی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی کە لە چوار خەستەخانەی گەورە لە ئەمەریکادا ئەنجامدراون، سەلماوە کە ( ٩٢٪ )ی دایکان- ئەگەرچی دووریش بن لە منداڵە ساواکانیانەوە - هەر هەست بە گریانی جگەرگۆشەکانیان دەکەن !..

ئەمەش جۆرێکە لە پەیوەندی (تەلیباسی) کە خودای گەورە لە نێوان دایکان و جگەرگۆشەکانیاندا خوڵقاندویەتی !

**خوێنەری ئازیز!**

ئەمە مشتێکە لە خەرمانێك کە زانستی نوێ پەی پێ بردووە لەو ملیۆنەها نهێنیانەی کە خودای گەورە لە لاشەی ئادەمیزاددا خوڵقاندویەتی ، بێگومان هێشتا زۆر نهێنی دیکەش هەن کە زانست پەی پێنەبردوون، بۆیە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سەرنجمان رادەکێشێت بۆ رامان و وردبوونەوە لە خۆمان، کە چۆن دروستکراوین و چەندە نهێنی لە دروستکردنماندا هەیە، ئەوەتا دەفەرموێت: (وفي انفسكم افلا تبصرون ؟!) .. دروستکردنی ئەم ئادەمیزادە بەم شکڵ وشێوازە جوانە و بەم گشت

نهێنی‌یـه سەرسـوڕهێنەرانەو بـەو پلـە بـەرزەی کـە خـودای میــهرەبان پێـی بەخشـیوەو، کردویـەتی بـە گەورەی دروستکراوەکانی و ڕێزی تایبەتیی لێناوە و ، فەرمانی داوە کە فریشتەکانی کڕنووشی ڕێـزی بـۆ ببــەن.. ئایـا دەچێتــە عــەقڵی کـام مرۆڤــی ژیــرو هۆشیارەوە ئـەم گشـت وردەکـاریی و بایـەخ پێـدان و ڕێزلێنانـە هــەرواو بـە هەوانتـەو بـێ هـوودە بێـت ؟!.. بێگومان ئەوە لە حیکمەتی خودای کاربەجێ و داناوە زۆر دوورە، وەکو خۆی دەفـەرموێت :( افحسـبتم انمـا خلقنـاكم عبثـاً وانكـم الينـا لا ترجعـون؟! )واتـە :ئایـا ئێوە وادەزانن کە ئێمە ئێوەمان بە هەوانتەو بێ هوودە دروسـتکردووە و ناتانگێڕینــەوە بــۆ لای خۆمـان و زیندووتـان ناکەینـەوە؟!..نـەخێر هـەرگیز وا نی‌یـە و وا تێ‌مەگەن..

لـە ڕوانگـەی ئـەم حەقیقەتانــەوە دەبـێ هــەموو مرۆڤێـك بــە وردی لـەم مەسـەلە گرنگـە ڕابمێنێـت و هـەوڵبدات بە جوانـی خودای خـۆی بناسـێت.. زانـای ڕۆژئـاوایی نـاودار (باسـکاڵ) جوانــی بـۆ چـووە کـە دەڵێت: تەنها دوو کۆمەڵ لە ناو خەڵکیدا شایانن بە

مرۆڤـی ژیـیر و هۆشـیار نـاو بـبرێن .. ئـەوانیش ئـەو کەسانەن کـە خـودای خۆیـان دەپەرسـتن، چونکـە بـە چـاکیی دەیناسـن ، هـەروەها ئـەو کەسـانەیش کــە بەردەوام هەوڵدەدەن و بە دوای خودادا دەگـەڕێن و، دەیانـەوێت بیناسـن..بێگومـان هـەر کەسـێك خـودای خۆی بە چاکی نەناسێت:

- تێناگات مەبەست لە دروستبوونی خۆی چییە و بۆچی هاتووەتە سەر ئەم زەوییە ؟! ..بۆیە هەمیشە ناثارامـەو سـەرگەردانەو نـاخی پڕیـەتی لـە پرسـیارو گومانی بێ وەڵام !

- لـە حیکمـەتی ژیـان و مـردن تێناگـات، بۆیـە زۆر زۆر لە مردن دەترسێت، سـەرەنجامیش ئەو میوانـە لـە کتوپڕێکدا و بێ‌پرس هەر یەخەی پێ دەگرێت !

- ئەمە جگە لەوەی کە ئەگەر ئادەمیزاد خـودای خـۆی بـە جوانــی نەناسـێت ، ئـەوە لـە ڕەحمـەت و یارمەتی و پشتیوانی خـودای باڵادەسـت و میـهرەبان خاوەنی ئەم کائیناتـە بێ‌بەش دەبێت و، هەمیشە لـە دڵڕاوکێیـەکی کوشـندەدا دەژی !.. چونکە بە ڕاسـتی تەنـها بـە ناسـین و بەندایـەتی کـردن بـۆ خـودای

پــــەروەردگار دڵـــی ئــادەمیزاد ئــارام دەگرێـــت و دەحەوێتەوە، خودا دەفەرموێت: ( الا بذكر الله تطمئن القلوب). بۆیە پێویستە هەموو مرۆڤێك بەوردی لەم باسانە بکۆڵێتەوەو بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بێت بە بەڵگەی بەهێزی زانستی،پەروەردگاری خۆی زیاتر و زۆرتر بناسێت و ئیمانی خۆی پتەوتر بکات ، بەوەش سەرفرازیی بۆ هەردوو ژیانی خۆی مسۆگەر بکات..

خودا یارمەتیی هەموو لایەکمان بدات بۆ ئەوەی بتوانین چاکترو جوانتر خۆمان بناسین، هەروەها چاکترو زۆرتریش ئەو پەروەردگارە بەخشندەو میهرەبانەمان بناسین ، تا خۆمان بگەیەنینە ریزی بەندە پاك و صالح و چاکەکانی، کە ئاسودەترین مرۆڤی ئەم سەرزەویەن.

خودا کوردستانمان ئاوەدان و گەلمان سەرفراز بکات و لە هەموو بەڵایەك بمانپارێزێت


سەرچاوەکان:

١- الطب محراب الايمان. ٢- قصة الايمان.

٣- الله والعلم الحديث. ٤- التوحيد للزندانی

٥- الانسان:اخرالمعلومات العلميه عنه..

٦-الانسان ومعجزة الحياة .

تەنها دوو کۆمەڵ لەناو خەڵکیدا شایانن بە مرۆڤی ژیرو هۆشیار ناو ببرێن.. ئەوانیش ئەو کەسانەن کە خودای خۆیان دەپەرستن، چونکە بە چاکیی دەیناسن.. هەروەها ئەو کەسانەیش کە بەردەوام هەوڵ دەدەن و بە دوای خودادا دەگەڕێن و، دەیانەوێت بیناسن.

زانای بەناوبانگی رۆژئاوایی:

( باسکاڵ )